ناوی پەرتووك: عەشقی كورد
نووسەر: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە توركیەوە: ئەستێرە عەبدولجەبار
هەڵەچنی و پیاچوونەوەی ڕێزمانی: سۆما حەمە سدیق نەجمەدین
دیزانی بەرگ: سەیوان سەعیدیان
دیزانی ناوەوە: ڕووناك رەسووڵپور
ژمارەی سپاردن:
چاپی یەكەم ـ 2008
تیراژ: 500
نرخ: 2000



**خوێنەری بەڕێز:**

ئەم پەرتووکەی کە لە بەردەستدایە یەکێکە لە کۆی دە پەرتووکی ئامادەکراو بۆ وەرگێڕان، لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی وەرگێڕاندایە و شیکردنەوەکانی بەڕێز "عەبدوڵلا ئوج ئالان"ە سەبارەت بە کێشەی ئازادیی ئافرەت. هەروەها تیشکی خستۆتە سەر هەموو لایەنە پەیوەستەکانی تر بەم کێشەیەوە" هەر لە: عەشق و خۆشەویستیەوە تا دەگاتە: سیاسەت و ڕێکخستن و فەلسەفەی ژیان و بونیادنانی کۆمەڵگایەکی نوێ و کەسایەتیەکەی...

ئەم شیکردنەوانە، هەر وەك لە ڕێکەوتەکانیشیانەوە دەردەکەوێت لە ساڵانی "96، 97، 98" دا لە ڕۆژهەڵاتی ناوین و ڕۆما پێش دەستگیرکردنی بەڕێز عەبدوڵلا ئوج ئالان بە پیلانگێڕییە نێودەوڵەتیەکە ئەنجامدراوە. هەروەك چۆن ئاستی قووڵبوونەوە و کۆششی ئەوکاتەی ئەومان بۆ دەخاتە ڕوو، لەهەمان کاتدا لە هەندێك شوێندا شەقڵی پارادیگمای وەبەرگیراوی ئەو سەردەمەی پێوە دیارە، بەڵام لە لایەکی تریشەوە یەکێك لە تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی فراوان کردنی لێکۆڵینەوە و نوێکردنەوەی لێکدانەوەیەتی سەبارەت بە هەر ڕووداو و دیاردەیەك" تەنها بەوەوە نەوەستانە کە دەیزانێت، زۆر بە ئاشکرا سەرەداوی ئەو پارادیگما نوێیەشی تێدا بەدیدەکرێت کە دوای پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییەکە لە پارێزنامەکانیدا پێشبینی

کــردووه و بریتییـــه لـــه ڕەتکردنـــەوەی هـــەموو جۆرەکـــانی: دەســـەڵاتگەرایی و دەوڵەتگەرایی لەسەر بنەمای خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ مێژوو.

هەموو ئەمانەش هـەر لـە سـەرەتاوە پەیوەندییـەکی بـەهێزیان بـە خوێندنـەوە و کۆششەکانیەوە سەبارەت بە کێشەی ژێردەستەیی ئافرەت و ئازادبوونیەوە هـەبووە و هەیە. ئەوەی کە جێی نیگەرانیە ناسینی خودی بەڕێز "عەبدوڵڵا ئوج ئـالان"ە بـە سـەرۆکی پارتێـك یـان بیرمەنـدێکی گـەورەی بزووتنەوەییـەکی کوردایـەتی یـاخود سـەرۆکێکی نەتـەوەیی و بـەس. لـە کاتێکـدا سـەبارەت بـە کۆمـەڵگای کـوردی و مرۆڤایـەتی و بەتایبـەتیش ئافرەتـان خـاوەنی کۆمـەڵێك تێـز و پراکتیکـی سـەروو ئاسایی، شایانی باسە کـە پێویسـتە نـەك لەلایـەن هـەر تـاکێکی کوردییـەوە، بـەڵکو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەموویەوە بەهەند وەربگیرێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

وەك ئافرەتێك هۆکارو پاڵنەری سەرەکیم بۆ وەرگێڕانی شاکارەکانی سەبارەت بە ئافرەت لەمەوە سەرچاوەی گرت. هەر بۆیە پێشم باشـترە لـە جیـاتی ئـەوەی لەمـە زیاتر لەسەر ناوەرۆکی پەرتووکەکە بـدوێم "بـەڕێز عەبـدوڵڵا" ئـوج ئـالان لـە زمـانی خۆیەوە بناسرێت و خودی خوێنەر لەمەدا سەربەست بێت. هیوادارم بۆ خوێندنەوە و پێکهێنانێکی نوێ ئافرەتان بەگشتی و پیاوان بەتایبـەتی سـوودێکی گـەورەی لـێ ببینن.

**وەرگێڕ**

## پێشەکیە تورکیەکە

"بانگەشەی ژیانم گەلێك گەورەیە. دەمەوێت ببمە خاوەنی ژیانێکی بە واتا و چالاکیەکی گەورە. لەبەرئەوەی ژیان و مرۆڤەکانم زۆر خۆش دەوێت، هەڵدەستم بە ئەنجامدانی ئەم چالاکیە"

کێ دەزانێت؟ پێش ئەوەی ئەم ڕستانە بنووسیت بۆ ماوەیەکی چەند درێژ ئارامانە بە بێدەنگی تێڕامانت کردووە؟ وەك ئەوەی بتەوێت پەردە لەسەر واتای بێدەنگیەکی هەزاران ساڵە هەڵبماڵیت. لە ژێر گووتەکانیشتدا جۆرێکی تر لە بێدەنگیت شاردبووەوە کە ئێمە پێی نامۆین. بۆ یەکەم جار لە قووڵاییەکەوە کە سەدان ساڵە هەوڵمانداوە پێیبگەین دەنگێکت بە ئاوازی ئەم خاکانە بەرزکردەوە. نەمان دەزانی دەتەوێت بڵێی چی؟ ویستمان شتێك لەو بێدەنگیە تێبگەین کە لە ژێر پێڵوی وەنەوشەیی نیگای وشەکانتدا ڕاکشابوو.

بێدەنگی: زمانی لێکدابڕان و دوورکەوتنەوەیەکی بێ سنوور بوو. ئەی لە ژێر ئەو جۆرە بێدەنگیەی پێش درکاندنی وشەکانتدا چ قالبوونەوە و داناییەك هەبوو" کە ئێمە لێی تێنەگەیشتبووین؟ بێ دوودڵی گەر لە پانتایی ئەم بێدەنگیەتدا لایەنێکی وێکچووی مردن هەبێت، هاوکات لایەنێکی وێکچووی کوشتنیش هەیە. لە نێو درکاندنتدا بۆ پیتەکانی (ژ، ی، ا، ن) جوانیەکی شاراوە هەیە، کە زەحمەتە ئێمە لێی تێبگەین.

هەستاین بۆ تۆیەك كە جوانیەكی بێدەنگ كراوی.. بۆ تۆیەك كە تێكەڵ بە شنەبا و غوباری خاكیت.. لەوێوە تێكەڵ بە ڕۆحمان بوویت چیرۆكێكمان گێڕایەوە..

چیرۆكی "سیبیل" بەڕاست ئەمە چیرۆكی كێ بوو؟ باش بیرمان نەدەهاتەوە، چیرۆكی كچە گریكیەك بوو؟ هەر چۆنێك بێت ئەوەی گرنگە لایەنێكی تۆ لەم چیرۆكەدا شاراوە بوو.

دەڵێن: كاتی خۆی ئافرەتێكی زۆر جوان بە ناوی "سیبیل" هەبووە، جوانی ئەم كچە هەر چاوی وردبینی مرۆڤەكانی بە شەوارە نەخستووە، بەڵكو خوداوەندەكانیشی سەرمەست كردووە. خوداوەند و مرۆڤ پێكەوە دەگەنە بڕیاری ئەوەی ئەم جوانییە بە نەمری خەڵات بكەن. هەڵدەستن سیبیل بۆ هەتا هەتایە دەخەنە قەفەسێكی شووشەوە تا پیر نەبێت و لە جێیەكی بەرچاوی نیگا شارەزاكان بە جوانی دایدەنێن تا هەمیشە لێی بڕوانن. سەدان ساڵ دێن و دەڕۆن و خەڵكی سەرمەستانە دێن بۆ تەماشاكردنی تەلیسمی ئەم جوانییە بێ وێنەیە. ڕۆژێكیان كەسێكی دڵ وریا بەرامبەر بە جوانی دەیەوێت بزانێت سیبیل هەست بە چی دەكات. دەچێت دەرگای قەفەزەكەی دەكاتەوە و لێی دەپرسێت ئەی سیبیلی جوان تۆ هیچ داخوازێكت نییە؟

سیبیل دەڵێت "تەنها داخوازم ئەوەیە كە بمرم"

بڵێی نەمریی ببەخشرێتە جوانی؟! یاخود تەلیسمی جوانی لە مردندا شاراوەیە؟ ئەی نەمریی جوانییەك چییە؟ بڵێی جوانی چ كاتێك تاكە داخوازی "مردن" بێت؟

مانای ئەو ڕاستیە بێدەنگ كراوەی لە ژێر تەواوی وشەكانماندا شاردراوەتەوە چییە؟ ئێمە وەك گوزارشتێكی ئازادی دەبێت چ سمبولێكی ترمان هەبێت؟ بڵێی لەناو گۆبەنە تێك ئاڵاوەكانی ئەم هەموو جۆرەی شەڕ و لە جیهانێكدا كە بوەتە خاڵی یەكتربڕینی "ژیان و مردن" بتوانین واتای هەڵسوكەوتەكانمان بدۆزینەوە و لێیان تێبگەین؟!

"بانگەشەی ژیانم گەلێك گەورەیە. دەمەوێت ببمە خاوەنی ژیانێكی بە واتا و چالاكیەكی گەورە. لە بەرئەوەی ژیان و مرۆڤەكانم زۆر خۆش دەوێت، هەڵدەستم بە ئەنجامدانی ئەم چالاكیە"

دەبوو دووبارەی ئەمە لە چیرۆكێكی كوردییەوە ببیستین، وە ئەو كچەی بە بیرداهێنایەنەوە كە هەردوو گلێنەكەی خۆی دەرهێناوە و لە فنجانی سپیدا پێشكەش

بـە مەعشـوقە کوێرکراوەکـەی کـردووە. تـۆ گیـان و جەسـتەی خـۆت وەك گلێنـە پێشکەش دەکرد و ئامێزت بۆ عەشق دەکـردەوە. ئـەو کاتـە زانیمـان بێـدەنگی نێـو وشەکانی هۆنراوەیەکی "ڕۆبین گالیسی" ت بۆ ئاشـکرا کـردووین کـە لـە سـاتەکانی پێش لە سێدارەداندا گووتبووی:

"کە وتیان مردووە ناوم مەبە

یازدە پیتی ناوەکەم بەسەر لێوت مەخە

خەو لە چاوم دەچۆڕێ

خۆشم ویست

دەسا هەقی خۆیەتی بێدەنگی

یەخەم بگرێ..."

چـالاکیەکەی تـۆ وەك وەڵامێکـی ئـاگرین لـە نێـو ئـەم پەنهانـە بـە وشـە پـەردە پۆشکراوانەوە سەری دەکرد و سەری ئاوازە زیندەبەچاڵکراوەکانی بەیەك شادبوونی لە سینەماندا هەڵدەدایەوە. لە سینەی ئاگرینیشتەوە دەروازەیەکت بـۆ کوردسـتانی خەیاڵکراو واتا بۆ خەیاڵی هەموومان یەکالا دەکردەوە. ئێستا هەموومان بەرەو ئـەم دەروازە ئاگرینــە و بــە ژێــر بــاڵی ســینەی ئاگرینتــدا بــەرەو خەیاڵــەکانمان دێینــە ژوورەوە. ئیـدی بـاس باسـی ڕۆژانێکـی بـە یـەك شـادبوونەوەیە، بـێ ئـەوەی قسـە بکەین.. وەیا پەنا ببەینە بەر ووشە ڕووپۆش کراوەکـان بـە تـەمی بێـدەنگی هـەموو گوێ کـەڕ بووەکـان گوێبیسـتی دەنگمـان دەکـەین. ئـیتر هـەموو زمانـە لاڵـەکان بـە وشەکانی ئاسمانی و خاکی و ئەڵماسییەکی قەشەنگ بۆمان دێنە گۆ.

لە نێو بێدەنگیەکی گەورەدا ئێمە سەرلەنوێ لە تۆدا لەدایك بووینەوە.

ئیـدی دێرسـیم بـێ ئـەوەی نـاوت بهێنێـت بـە بـای پـڕ لـە پزیسـکی بڵێسـەی لێگەڕینەکانتـــدا دەتناســـێتەوە و یـــادت دەکاتـــەوە. بـــەڵێ دڵـــی کـــەڕمان ئـــیتر دەبیستێت.. دەزانێت کە ئەو بایەی لە شاخ و دۆڵەکانی ئەم وڵاتەدا بـە شـوێن تاڵـە قژە ئاگرینەکانەوەیە دەنگی تۆیـە. دەزانێـت ئـەوەی بۆتـە بینـایی و بەسـەر ئـەم خاکانەدا پەرش بووە چاوی تۆیە.. دەزانێت ئەوەی وەك گەنم هەر دەنکێکـی هـەزار دەنکی لێدەکەوێتەوەو بەسەر ئەم خاکانەدا تۆو کراوە هەر تـۆی. بـەڵێ گوێبیسـتی دەنگت بووین و لە بانگت تێدەگەین. ئیدی ڕووناکی و تینی ئاگرەکەت دەناسین.

بێ ئـەوەی نـاوت بهێـنین بـە میلۆدیەکـەت گـۆرانی بـە یـەك شـادبوون بـۆ یـەکتر دەچڕین.

ئێمە بە تۆوە سەرلەنوێ لەدایك بووینەوە، تۆیەك کە لە بێدەنگی ژێر وشەکانەوە دوا گۆرانی خۆت وەها دەچڕاند:

"بانگەشەی ژیانم گەلێك گەورەیە. دەمـەوێت ببمـە خـاوەنی ژیـانێکی بـە واتـا و چالاکیەکی گەورە. لەبەرئەوەی ژیان و مرۆڤەکانم زۆر خۆش دەوێت، هەڵدەسـتم بـە ئەنجامدانی ئەم چالاکیە"

ژانی گۆرانیەکـەی تـۆ مارشـاڵەکانی[1] جـەنگ دێنێتـە گریـان. بـە ملیۆنـان ڕۆحـی کوژراو بە مۆتەکەی دەستی ئەوان زیندوو دەبنەوە و دەستیان دەگـرن و دەیانبەنـە سەر یەکە بە یەکەی گـۆڕە بەکۆمەڵـەکان لـە کوردسـتان. لـەوێ بـەدیار ئـەم شـوێن پەنجانــەی خۆیانــەوە ســەر شــۆڕدەکەن و بــە دەم گۆرانیەکــەی تــۆوە دەگــرین. گۆرانیەکەت بۆ ئێمە و برایانمان شایی و بۆ مارشـاڵەکانیش شـین و ڕۆڕۆ دەنێتـەوە. ئەوەتا مارشاڵەکان لە گۆمی فرمێسکی خۆیانـدا خەریکـە بخنکـێن. ئیـدی ئـەوە زۆر باش دەزانین کە ئەم فرمێسکانە بۆ ئەو جەلادانەیان نابارێنن کـە بـە دەسـتی ئێمـە ڕۆحیان کێشرا، بەڵکو بۆ ڕووڕەشی سەدان ساڵەی قڕکردنی ئافرەتـان و منداڵانمانـە شین دەگێڕن.

جوانیـت لـە تێکەڵبونـدا بـە خـاك و بـای پـڕ بـوو بـە هەناسـەی هەریەکـەمان، هەمووومان بەرەو لای خۆی کەمەندکێش دەکات. ئیدی بێـژەی شـادومانی و بـە یـەك شادبوون لەسەر لێوی هـەموومان دەخەنێتـەوە. کەواتـە ئـەو بێدەنگیـە وێکچـووەی لەیادکردن کە لە ژێر وشەکاندا شاراوەبوو دەبوو بگۆڕایە بۆ ئـەم دوا گۆرانیـەی تـۆ. گوێبیستی دەبین.. لێی تێدەگەین.. پـەیجووری دەبـین تـا لەبـەر تیشـکی ڕووناکی تۆدا واتای وشەکان ڕوون بخوێنینەوە.

ئێسـتا دەڵـێین دەبـوو ئەمـە یـەکێك لـە چـیرۆکەکانی گـەلی هیندسـتان بووایـە و دەکەوینە باسـی وێکچـوونی جـوانی تـۆ و پەپوولـەی چـوارەم. بـەڵێ چـیرۆکی ئـەو "چوار پەپوولەیە"ی بڕیاریاندا بـزانن پێناسـەی ڕاسـتینەی ئـاگر چـییە؟ پەپوولـەی یەکەم کاتێك دەچێت لەدوورەوە بـە دەوری ئـاگردا دەسـوڕێتەوە و دێتـەوە دەڵێـت

---

[1] لە سەردەمی ئیمپراتۆرەکاندا بەو کەسانە وتراوە کە لەرووی تاکتیکیەوە سەرپەرشتیاری جەنگیان کردووە. ئەم مارشاڵانە لەتورکیا تا ماوەیەك لەسەردەمی کۆماریشدا هەبوون.

"ئـاگر ڕووناکیـە" ئەمـە بـە زانیاریـەك دانـانێن کـە ڕاسـتیان بـۆ ئاشـکرا دەکـات و پەپوولەی دووەم دەچێت و زیاتر لە ئاگر نزیك دەبێتـەوە، کـە دەگەڕێتـەوە دەڵێـت "ئاگر تین و گەرماییە" ئەمەشیان بۆ گوزارشتکردن لە ڕاستی ئاگر بە کـەم دەزانـن. پەپوولـەی سێهەم دەچێت و لـە دوانەکـەی تـر زیـاتر لـە ئـاگر نزیـك دەبێتـەوە تـا باڵەکانی هەڵدەکڕوزێن، دەگەڕێتەوە دەڵێت "فەرموون ڕاسـتی ئـاگر ئەمەیـە و ئـاگر سـووتێنەرە" پەپوولـەی چـوارەم ئەمەشـیان بـە کـەم دەزانێـت و خـۆی دەڕوات و هێندە لە ئاگرەکە نزیك دەبێتەوە باڵەکانی دەسووتێن و لەپڕ خـۆی فڕێدەداتـە نـاو ئاگرەکــەوە و دوای ڕووناکیــەکی گــەورە لــەناو کڵپــەی ئاگرەکــەدا دەڕوات و ون دەبێت. تەنها پەپوولـەی چـوارەم تـوانی بزانێـت پێناسـەی ڕاسـتینەی ئـاگر چییە، بەڵام ئیدی ناشتوانێت بگەڕێتەوە و بەوانی تر بڵێت.

لەناو ئێمەشدا تەنها تۆ توانیت پێناسـەی ڕاسـتینەی ئـاگر بناسـیت. ئێمـەش بـۆ ئەوەی لە پێناسەی ڕاستیی ئـاگر تێبگـەین پـەیجووری تـۆ دەبـین و دەڵـێین "ئـەی ئاگر! ئاگری جوان بمانسووتێنە و ڕاستی ژیانمان پێ بڵێ..."

**دەزگای بڵاوکردنەوەی سەرخۆ بوون**

**ناوەرۆک...**


**شکۆمەندی.............................** 15

**زیلان.. سەرکێشێکی ئاگرین................** 41

**دایک...................................** 57

**قارەمانێکی تراژیدی.......................** 81

ئەوەی سەرکەوتنی نەبێت عەشقی نابێت.......... 89

ژیان بە ژنەوە بەهادارە......................... 114

**من عاشقی ئازادیم.........................** 141

**ڕووبەڕوو بوونەوەکان......................** 165

**پێهەڵگرتن بە شوێن یەکەمین جەنگاوەردا.........** 184

**تیشکۆکانی هۆشیاری.......................** 211

**خەنجەر..................................** 221

**سوارییەکان...............................** 231

**سۆزەکانی میزۆپۆتامیا......................** 240

فەرهەنگۆک.................................. 241

**"جوان خۆی لەوانە دەشارێتەوە کە پەیجووری ڕاستی نین"**
**ئاندریێ ترۆفیسکی**

